# بۆبی
# نەوێریت بفڕێت



وەرگێڕان ژ ئینگلیزی

دیان جەمیل




حکومەتا هەرێما کوردستانێ
وەزارەتا رەوشەنبیری و لاوان
رێڤەبەریا گشتی یا راگەهاندن و چاپ و بەلاڤکرنێ
رێڤەبەریا چاپ و بەلاڤکرنێ - دهۆك

---

❖ ناڤێ پەرتووکێ: بۆبی نەوێریت بفڕیت
❖ نڤیسەر: Ethan Crownberry
❖ وەرگێڕان ژ ئینگلیزی: دیان جەمیل
❖ بابەت: چیرۆکێن زارۆکان
❖ تیپچنین: کاژین جەمیل
❖ دیزاینا ناڤەرۆکێ: بێوار محەمەد
❖ قەوارە: 26.5 سم × 18.5سم
❖ ژمارا لاپەران: 45
❖ تیراژ: 500
❖ چاپا ئێکێ 2013
❖ ژمارا سپاردنێ: 2217

# بۆبی
# نەوێرێت بفڕێت

وەرگێڕان ژ ئینگلیزی

**دیان جەمیل**

بۆبی مێشەکا هنگڤینی یا بچویکە و دگەل دایک و باب و خویشک و برایێن خۆ دناڤ شانەیەکا هنگڤینی دا ل ناڤ دارستانێ دژیت.
بۆبی هێشتا یێ بچویکە لەو نزانیت وەکی هەمی مێشێن دی یێن هنگڤینی بفڕیت.





ئەو شانەیا هنگڤینی یا بۆبی تێدا دژیت ل سەر چەقێ دارەکێ یە و ئەو دار ژی گەلەك یا بلندە، ئانکو دەستێ کەسێ ب ساناهی ناگەهیتێ و کەس نەشێت ب ساناهی ژی مالا وان ببینیت.

بۆبی کوڕێ شاها مێشا هنگڤینی یە، ناڤێ دایکا وی شاهـ مارینایە.

بۆبی گەلەك خویشک و برا یێن هەین، لێ ئەو ناڤێ هەمیان نزانیت چونکی هژمارا وان گەلەك یا مەزنە، بۆبی پتریا دەمێ خۆ دگەل سێ هەڤالێن خۆ یێن نێزیک د بورینیت ئەو ژی پۆل، جۆرج و جۆنی نە.

ئەڤ هەر چوار هەڤالە گەلەك حەز ژ ئێک و دوو دکەن و بەردەوام یاریان پێکڤە دکەن، دیسان هەردەم یێن دگەل ئێک و گروپەکێ ب هێزن.





چیرۆکا مە بەحسێ سەرهاتییەکا بۆبی دکەت، ئەو ژی دەمێ وەرزێ بهارێ دەست پێکری و داروبار شینبووین و گول وڕیحانان خەملا خۆ دایە دارستانێ.

د ئێکەم رۆژا بهارێ دا، بۆبی و پۆل و جۆن و جۆرج ژ شانەیێن خۆ دەرکەفتن و تەماشەی وی دیمەنێ جوان کرن یێ بهارێ دگەل خۆ ئینایی، ب ڕاستی ئەو دەمەکێ درێژبوو ئەو د مالێن خۆڤە و ژ بەر سەرمایا زڤستانێ، نەدشیان دەرکەڤنە ژ دەرڤە.

ژ نشکەکێڤە دەمێ وان یاری دکرن، جۆنی وەکی هەر جار هزرێن خۆ یێن خراب و درندانە بکارئینان. هزرێن وی هەمی د شاشبوون و وی گەلەك حەز ژ کارێن خراب و دوژمنکارییێ دکر. ئەڤ جارە ژی وەکی هەر جار وی دڤیا کارەکێ نەباش ب هەڤالێن خۆ بدەتە کرن، لەو گۆتێ: ئەڤرۆکە ئەم دێ فرین و بەرەڤ جهەکێ دویر چین و پاشی دێ زڤرینە مال.





هەرچەندە ل دەستپێکی هەمی هەڤالێن وی ئەڤ داخوازیا وی ڕەتکر، ب تایبەت ژی بۆبی، چونکی هێشتا ئەو زارۆبوون و باش فێری فڕینێ نەببوون.

بۆبی گوتە هەڤالێن خۆ: نابیت ئەم بەرەڤ جهێن دویر بچین، چونکی هەتا نۆکە بتنێ مە ئێک وانە ل سەر چەوانیا فڕینێ ژ مامۆستایێ خۆ یا وەرگرتی، لەو نابیت ئەم ژیانا خۆ بێخینە د مەترسیێ دا و بفڕین.

لێ مخابن جۆنی گوهێ خۆ نەدا ئاخفتنێن بۆبی و گۆتێ: ئەز ب خۆ دێ چم، فڕم و دێ گەریانەکا خۆش د ناڤ دارستانێ دا کەم، چونکی ئەز یێ مەزنبوویم و من پەڕێن ب هێز و چالاك ژی یێن هەین، ڤێجا ما دێ بۆچی ترسم، لێ توو بۆبی، توو وەکی چیچەلۆکەکا ترسنۆکی و توو بخۆ نەوێری ژ مال دەرکەڤی. پاشی جۆنی سەحکرە هەردوو هەڤالێن خۆ یێن دی و گۆتێ: ئەرێ هوین دێ دگەل من هێن یان ژی هوین ژی وەکی ڤێ چیچەلۆکێ دترسن.





دەمێ جۆنی ئەڤ ئاخفتنێن نەخۆش گۆتینە پۆلی و جۆرجی وان هەست ب شەرمێ کر، لەو گۆتێ ئەم ژی دێ فڕین و مە ژی شیان یێن هەین. پاشی ئەڤ هەر سێ هەڤالە پێکڤە فڕین و گڤ گڤەکا بلند ژ خۆ ئینان و ل دۆرماندۆری سەرێ بۆبی دزڤڕین و بەردەوام دگۆتنێ: چیچەلۆکا ترسنۆک،

چیچەلۆکا ترسنۆک،

چیچەلۆکا ترسنۆک.

دەمێ بۆبی هەر سێ هەڤالێن خۆ ب ڤی شێوەی دیتین، بۆ وی گەلەك نەخۆشبوو و هەست ب شەرمێ و لاوازیێ كر، چونكی ئەو نەدشیا وەكی وان بفڕیت. هەر سێ هەڤالێن بۆبی بەردەوامبوون ل سەر فڕینێ و د هەمان دەمدا بۆ خۆ یاری و تڕانە ژی ب بۆبی دكرن.





بۆبی د دلێ خۆ دا گۆت: ما ئەز ب چ ژ هەڤالێن خۆ کێمترم و من ژی وەکی وان پەڕێن هەین و ئەز دشێم بۆ فڕینێ بکاربینم. بۆبی پەڕێن خۆ ڤەکرن و پیچەکێ خۆ بلند کر، لێ هێشتا دوو سێ پێنگاڤان بلند نەبووی چاڤێن وی زڤڕین و هەست ب ترسەکا مەزن کر، هەرووەسا پیچەك مابوو بکەڤیتە سەر ئەردی، لەو هەر زوی ڤەگەڕیا سەر چەقێ دارێ.

بۆبی زانی کۆ ئەو نەشێت وەکی هەڤالێن خۆ بفڕیت، ژبەر هندێ وی هەست ب نەخۆشیەکا مەزن کر و گەلەك ب خەم کەفت و کرە گری، بۆبی هزر دکر ئەو ژ ڕاستا کەسەکێ ترسنۆك و لاوازە، لەو نەشێت وەکی هەڤالێن خۆ بفڕیت و ژ ڤێ گولێ بچیتە سەر گولا دی و خوارنێ بخۆت.





هەڤالێن بۆبی دبەردەوامبوون ل سەر ترانێن خۆ، ب تایبەت ژی دەما دیتی، کۆ ئەو نەشێت بفڕیت و دترسیت، وان پتر یاری پێکرن و پێ دکرنە کەنی. ژبەر ڤێ چەندێ بۆبی هەست ب شەرمێ دکر و بڕیار دا ڤەگەریتە ناڤ شانەیا خۆ و ئێدی نەدەرکەڤیتە ژ دەرڤە.

دەما خاتوین مارینایێ کۆ دایکا بۆبی بوو، بۆبی ب ڤێ شێوەی دیتی، هاتە دەڤ وی و پرسیار ژێکر، کا بۆچی ئەو یێ خەمگینە؟

بۆبی گۆت: ئەڤرۆکە بۆ من دیاربوو ئەز کەسەکێ ترسنۆکم و نەشێم بفرم، دەما ئەز پیچەکێ فریم چاڤێن من زڤرین و من هەست پێکر ها وەختە دێ کەڤمە ئەردی، لەو من بریار دا ئێدی ژ مال نەدەرکەڤم.





پشتی دایکا بۆبی گوه ل ڤان ئاخفتنێن وی بووی، پێ کره کەنی و دەستێ خۆ دانا سەر سەرێ وی و گۆتێ: خۆشتڤیێ من، تشتەکێ گەلەك ئاساییە مێشێن هنگڤینی یێن د ژیێ تەدا نەشێن بفرن، چونکی هێشتا تو گەلەك یێ بچویکی و پەرێن تە باش نەڤەبوینە، لێ دڤێت تو هەولێ بدەی خۆ فێری فرینێ بکەی، چونکی گولێن جوان دێ مینە ل ژڤانێ تە و دڤێت تو هنگڤینی دروست بکەی.

پاشی دایکا وی گۆتێ: رابە دا بچینە مالا مامۆستا رینگۆی دا کو ئەو نیشا تە بدەت کا چەوا دێ فێری فرینێ بی.

ماموٚستا ڕینگوٚ مێشەکا هنگڤینی یا قەلەوبوو و پتریا دەمێ خوٚ ب نڤستنێڤە دبوٚراند، لێ دگەل هندێ ماموٚستایەکێ گەلەك زیرەك و خودان شیانبوو و ئەوی مێشێن هنگڤینی یێن بچویک فێر دکرن کا چەوا دێ فێری فڕینێ بن و هەست ب ترسێ نەکەن.





شاهـ مارینایێ گۆته مامۆستا ڕینگۆی: ئەڤە کوڕێ من بۆبی یە، من یێ ئینایە دەڤ تە دا کۆ هندەك وانەیان دەربارەی چەوانیا فڕینێ بدەیێ، چونکی ئەو گەلەك دترسیت و نەوێریت ژ دارەکێ بۆ ئێکا دی بفڕیت و خۆ بلند بکەت، ژبەرکو هزردکەت دێ ب ئەردی کەڤیت

مامۆستا ڕینگۆی ب کەیفخۆشیڤە پێشوازی ل بۆبی کر و دانا سەر پشتا خۆ و پاشی بلند فڕی، ل ڤێرێ مامۆستای نیشا وی دا کا چەوا دێ دەست ب فڕینێ کەت و تا چەندێ دێ خۆ بلند کەت، هەروەسا گەلەك وانێن دی یێن گرنگ، یێن کۆ پەیوەندی ب فڕینێڤە هەی نیشا وی دان.





پاشی هەردوو پێکڤە چوونە جهەکێ ئارام و مامۆستای دەست ب گۆتنا هندەك شیرەتێن گرنگ کر و گۆتە بۆبی: دڤێت توو ب چ رەنگان خۆ ژ فرینێ نەترسینی و پێدڤییە بەردەوام دوو تشتێن گەلەك گرنگ ل بیرا تەبن، دا کۆ باوەریێ بۆ تە چێکەن توو دشێ بفڕی. ئەو ژی:

ئێک: تو مێشا هنگڤینی.

دوو: تە دوو پەڕ یێن هەین.

هەروەسا پێن تەژی دێ هاریکاریا تە کەن، دەما تو خۆ بلند دکەی و نابیت تو ژبیر بکەی، کۆ دڤێت پەڕێن خۆ ژی باش ڤەکەی.

بۆبی باش گوهداریا مامۆستای دکر و پاشی خۆ بەرهەڤکر ئەو شیرەتێن مامۆستای بۆ گۆتین نۆکە ب کاربینیت و هەول بدەت بفڕیت، بۆبی خۆ بەرەڤ ئەسمانان بلند کرو نێزیکی مەترەکێ فڕی.

دەما بۆبی دیتی ئەو یێ دشێت بفڕیت گەلەك کەیفا وی هات و ب دەنگەکێ بلند و دێمەکێ گرنژی گۆت: هێ هێ هێ، ئەز دشێم بفڕم، ئەز ناترسم.





بۆبى هەولدا پتر خۆ بلند بکەت، هەڤالێن وى ئەو دیتن و ب مەندەهۆشیڤە گۆتن: ئەرێ ما وێ هە نە بۆبى یە؟ سەحکەنێ ئەو یێ دفڕیت، ئەو کەنگى هۆسا ب جەسارەت کەفتیە و دوێریت بفڕیت؟ ڕاستى تشتەکێ گەلەك سەیرە ئەم قەت باوەر ناکەین.

دەما چاڤێ بۆبی ب هەڤالێن وی کەفتی، هەولدا خۆ پتر بلند بکەت، دا کۆ بۆ وان دیار بکەت ئەو نەیێ ترسنۆکە و دشێت گەلەك بلند بفڕیت، لێ ژبەرکو هێشتا ئەو باش فێری فڕینێ نەبوویە، لەو هەڤسەنگیا خۆ ژ دەست دا و پەڕێن وی تێکچوون و ئێدی نەشیا خۆ هەلبگریت، پاشی هێدی هێدی هاتە خوار، هەتا کەفتیە سەر ئەردی.





بۆبی کەفتە سەر ئەردی، مامۆستا ڕینگۆ هاتە دەڤ وی و سەحکرێ کا یێ ب سلامەتە، لێ باشبوو چ ل بۆبی نەهاتبوو و یێ ب سلامەتبوو. مامۆستا ڕینگۆی گۆتێ: پێدڤییە تو هێدی هێدی خۆ بلند بکەی، هەتا کۆ توو هەڤسەنگیا خۆ د ناڤ هەوایی دا بپارێزی، هەر وەسا ئەڤرۆکە ڕاهێنانێن مە ب دووماهی هاتن، لێ ئەز دێ ڕۆژانە وانەیان بۆ تە بێژم، هەتا تو باش فێر دبی کا چەوا دێ فڕی و ناکەڤیە ئەردی.

بۆبی رۆژانە د چوو دەڤ مامۆستا ڕینگۆی دا کۆ ڕاهێنانان بکەت، لێ هەر جارا بۆبی ڤیابا خۆ گەلەك بلند بکەت ئێکسەر دا ب ئەردی کەڤیت و نەدشیا بفڕیت، لەو ڤێ چەندێ بۆ وی گەلەك نەخۆش کر و د دلێ خۆ دا دگۆت: هندی ئەز هەول ددەم ئەز نەشێم ئێدی بفڕم، نزانم کا ئاریشا من چییە؟





مامۆستا ڕینگۆی بۆبی دانا سەر دارەکێ و دەستێ وی گرت و گۆتێ: خۆشتڤیێ من، ئاریشا تە ئەوە، دەما تو بلند دبی، تو هزرا کەفتنێ دکەی، لەو تو کۆنترۆلا خۆ ژ دەست ددەی و تە ئاگەه ژ خۆ نامینیت، هەروەسا پەڕێن تەژی د ڕاوەستییێن و توو ب ئەردی دکەڤی، دڤێت توو بەردەوام پەڕێن خۆ بلڤینی و ئەگەر تە ئەڤ چەندە کر ئێدی تو قەت ناکەڤی.

بۆبی گەلەك بێزاربوو گۆت: ئەز چ جارا فێری فرینێ نابم، لەو ئێدی هەول نادەم بفرم.
دەما مامۆستایێ وی ئەڤ ئاخفتنە گوهـ لێبوی، پێ کرە کەنی و گۆتێ: خۆشتڤیێ من، ئاها ئەڤە خالا تە یا لاوازیێ یە، تە باوەری ب خۆ و ب شیانێن خۆ نینە و تو زویکا بێ هیڤی دبی، هەلبەت ئەڤ چەندە ژی تشتەکێ نەیێ باشە و دڤێت تو خۆ بێ هیڤیی نەکەی.





دەما بۆبی چوویە مال وێ شەڤێ هەمیێ هزرا خۆ د ئاخفتنێن مامۆستایێ خۆدا دکر، رۆژا دی سپێدی زوی چوو دەڤ مامۆستا رێنگۆی دا کۆ جارەکا دی دەست ب راهێنانان بکەت و بۆ مامۆستای دیار بکەت کۆ ئەو هێشتا بێ هیڤی نەبوویە ژ فرینێ و دێ یێ بەردەوام بیت ل سەر راهێنانان، هەتا بشێت بفریت، لێ دەما کەهشتییە جهێ راهێنانان، مامۆستا رێنگۆ ل وێرێ نەدیت.

بۆبی پیچەکێ خۆ ل وی جهی گرت، لیٚهەر
مامۆستایێ وی دیار نەبوو لەو نەچاربوو بچیت
لیٚ بگەریت، پیچەکێ ویٚڤەتر وی هەر سێ
هەڤالیٚن خۆ پۆل و جۆن و جۆرج دیتن، دەما
نیٚزیکی وان بووی، دیت ئەو هەر سێ یێ بەرێ خۆ
ددەنە تشتەکی و ییٚن ماینە بیٚدەنگ.
ب ڕاستی تشتەکێ نەخۆش بوو روودایی و
کەس نەدشیا باخڤیت.





ل وی دەمێ مامۆستا ڕێنگۆی چوویە ناڤ باخچێ مالەکێ، دا کۆ شێلاڤا گولان بمێژیت، پیچەکێ بێهنا خۆ ڤەدا و د ناڤ گولەکێ دا نڤستبوو، لێ ژ نیشکەکێڤە خودانێ مالێ هاتە ناڤ باخچەی و ئامیرێ دروینا گیایی دابوو کاری.

مامۆستایی ئاگەه ژ دەنگێ ئامیری نەبوو، لەو کەفتبوو بن ئامیری و پەڕێن وی شکەستبوون و نەدشیا بفڕیت، د هەمان دەمی دا خودانێ مالێ یێ بەردەوامبوو ل سەر دروینا گیایێ د ناڤ باخچەیی دا.

پەڕێن مامۆستا ڕینگۆی شکەستینە و ئەو نەشێت بفڕیت، ئەگەر ئەم هاریکاریا وی نەکەین جارەکا دی خودانێ مالێ دێ ئامیرەی ل سەر وێ گولێ ڕا ئینیت یا ئەو تێدا و دێ کوژیت، دڤێت ئەم ب لەز د هەوارا وی بچین.

ب ڤان گۆتنان بۆبی داخاز ژ هەر سێ هەڤالێن خۆ کر بچن مامۆستای ڕزگار بکەن، لێ مخابن وان گۆت مە شیانێن فڕینێ نینن و ئەگەر ئەم بفڕین ژی دێ ب ئەردی کەڤین، ڤێجا ئەم نەشێن هاریکاریا وی بکەین.





بۆبی گەلەك ژ هەڤالێن خۆ تۆرەبوو، لەو ب دەنگەکێ بلند گۆتێ: هوین چیچەلۆکن، هین دترسنۆکن، ئێدی ئەز هەڤالینیا هەوە ناکەم.

پاشی بۆبی ب لەز فڕی و چوو دا کۆ هاریکاریا مامۆستایێ خۆ بکەت و قورتال بکەت، بۆبی هەمی هێز و شیانێن خۆ بکارئینان و شیرەتێن مامۆستایی ژی هاتنە بیرا وی. وی ئەو شیرەت ب جهـ ئینان لەو نۆکە ئەو گەلەك بلند یێ دفڕیت ژی، لێ هەر ناکەڤیت.

بۆبی ب لەز بەرەڤ وی باخچەیی چوو یێ مامۆستا ڕینگۆ د ناڤ دا، وی دیت مامۆستایێ وی یێ بریندارببووی و خۆ نەشێت پێنگاڤەکێ بهاڤێژیت، هەر وەسا خودانێ مالێ ژی یێ ئامیرێ خۆ بەرەڤ وی جهی دبەت یێ مامۆستا د ناڤ دا و ئەگەر بۆبی ب لەز نەچیت وی قورتال بکەت، دێ کەفتە بن ئامیری و دێ مریت.





دەمێ مامۆستا ڕینگۆی بۆبی دیتی گەلەك کەیفا وی هات، کۆ ئەڤ قوتابیێ وی یێ ژ هەموویان بچویکتر د هەوارا وی هاتی و ژ هەمیان ب جەسارەتتربوو.

هەر وەسا کەیفا وی ب هندێ ژی هات، کۆ نۆکە بۆبی دشێت بفڕیت و ئەو زەحمەتا وی پێڤە بری ب ئاڤێدا نەچوو.

مامۆستا ڕینگۆی داخاز ژ بۆبی کر، کۆ نەمینتە دناڤ باخچەیی دا و ب لەز ژ وێرێ بچیت و خۆ قورتال بکەت و وی بهێلتە ل وێرێ، لێ بۆبی ب چ ڕەنگان ڕازی نەبوو مامۆستایێ خۆ بتنێ بهێلتە د ناڤ باخچەیی دا، بەلکو بڕیار دا هەمی هێز و شیانێن خۆ بکاربینیت و وی قورتال بکەت.





وی دەمێ بۆبی و مامۆستایێ خۆ گەنگەشە دکرن، خودانێ مالێ هێشتا یێ ل سەر دروینا گیایێ د ناڤ باچەیی دا بەردەوامبوو و نۆکە ئامیرێ دروینا گیایی بەرەڤ وی جهی دئینیت یێ ئەو لێ، ژبەرکو گەلەك گیا ل وێرێ مابوو کۆ هێشتا نەهاتبوو دروین.

پیچەك مابوو ئامیرێ دروینا گیایی بۆبی و ماموستایێ وی هەردووکان پێکڤە د گەل گیایی ببەت و بکوژیت، لێ بۆبی دەستێ ماموستا ڕینگۆی گرت و هندی هێز د لەشێ وی دا هەیی بکارئینا و پەڕێن خۆ ب لەز لڤاندن و خۆ بلند کر، ب ڤی ڕەنگی شیا ماموستایی ژ ئامیرێ دروینا گیایی دویر بکەت و ژوی جهی ب ڕەڤن.





لێ ژیەرکو مامۆستا ڕینگۆ پیچەك یێ قەلەوبوو و کێشا وی یا مەزنبوو لەو بۆ زارۆیەکێ وەکی بۆبی یا ب زەحمەتبوو بشێت وی بهەلگریت، ژیەرکو هێشتا ئەو ب خۆ باش فێری فڕینێ نەبوویە، لەو پیچەکێ نێزیکی ئەردی بوونەڤە و وەختبوو بکەڤنە بن ئامیری.

لێ بۆبی قەت بێ هیڤی نەبوو و دەست نەداهێلان بەلکو جارەکا ب لەز پەڕێن خۆ لڤاندن و هەوڵ دا خۆ گەلەك بلند بکەت.

دەمێ بۆبی خۆ بێ هیڤی نەکری و هەمی هێز و شیانێن خۆ بکارئینناین شیا گەلەك خۆ بلند بکەت و مامۆستایێ خۆ ژی قورتال بکەت و ژ ناڤ وی باخچەیی دویر بکەڤن، بۆبی د ڤێ دەلیڤا تەنگ دا مفا بۆ خۆ ژ وان شیرەتان وەرگرت یێن مامۆستایێ وی ل دەمێ ڕاهێنانێن فڕینێ بۆ وی گۆتین.





پشتی بۆبی شیای مامۆستا ڕینگۆی ژ ناڤ باخچەیی هەلبگریت و قورتال بکەت، وی مامۆستا برە مالا وی و ئێکسەر چوو نوژدارەك بۆ ئینا دا کۆ هاریکاریا وی بکەت و پەڕێن مامۆستایی دەرمان بکەت، چونکی پەڕێن وی شکەستبوون و نەدشیا بفریت.

ئەڤ چەندە ژی، بوو ئەگەرێ ئەو بۆ ماوێ چەند رۆژەکان بمینتە د ناڤ جهێن خۆ دا و نە دەرکەڤیت، هەتا کۆ جارەکا دی پەڕێن وی ساخ دبن و ساخلەم دبیت.

ئەڤ كارێ مەزنێ بۆبی كری، بوویە جهێ كەیفخۆشیا هەمی مێشێن هنگڤینی، لەو شاهـ مارینایێ ژی بڕیار دا ئاهەنگەكا مەزن ساز بكەت و هەمی مێشێن هنگڤینی داخواز بكەتە ڤێ ئاهەنگێ، هەر د ڤێ ئاهەنگێ دا شاهـ مارینایێ دیاریەك پێشكێشی بۆبی كر و سۆپاسیا وی كر بۆ وی كارێ مرۆڤایەتی یێ وی ئەنجامدایی.






ساڵ هاتن و دەربازبوون، بۆبی مەزنبوو و بوو ئێک ژ مێشێن هنگڤینی یێن گەلەک چەلەنگ و خودان هێز و شیان. ئێدی کەس نەدشیا وەکی بۆبی بلند بفڕیت و بچیتە جهێن بلند، ب ڕاستی ژی کەسێ نهێنیا ڤێ چەندێ نەدزانی،

لێ ئەگەرێ ڤێ چەندێ بۆ وان شیرەتان دزڤڕی، یێن مامۆستا ڕینگۆی پێشکێشی بۆبی کرین ل دەمێ ئەنجامدانا ڕاهێنانێن فڕینێ.

هەر شەڤ بۆبی بەری بنڤیت هزرێن خۆ د شیرەتێن ماموستا رێنگۆی دا دکەت، و بیرهاتنا وان رۆژێن خۆ یێن خۆش ئەوێن ل دەمێ زارۆکینیێ د گەل ماموستایێ خۆ بۆراندین دکەت.

هەر وەسا بەردەوام ئەو هەر دوو شیرەت یێن ل بیرا وی دەمێ ماموستایی بۆ وی گۆتین، ئەو ژی کۆ گۆتبوویێ ئەگەر تە دڤێت کارەکی بکەی، نابیت تو ب چ رەنگان خۆ بێ هیڤی بکەی، خۆ ئەگەر ل دەستپێکێ تو چەند جاران توشی نەخۆشیان ببی و ب سەرنەکەڤی، لێ پشتراستبە ئەگەر تو یێ بەردەوامبی و دەستان نەداهێلی دێ هەر گەهیە سەرکەفتنێ.

